ناڤێ پەرتوكێ: گرێبەستێن فەیدەبووی

كومكرن و وەرگێران: أبو بكر كوچر

سالا: ١٤٣٢ھ /٢٠١١ م

چاپ كرن : پەرگەھا سیما / سێمێل

# بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمد لله وحده والصلاة والسلام على من لا نبي بعده .. وبعد :**

**برايێ موسلمان مەزنترين دەليل ژ بۆ دلوڤانيا خودێ دگەل عەبدێن وى، فەرمانا وان يا كرى كو عەبدينيا وى بكەن لدويڤ هندەك عيبادەتان كو هەمى بشێن ئەنجام بدەن، و ئەڤ عيبادەتە هند بساناهينە كو چ زەحمەت يان دەمەكێ درێژ پێ نەڤێت ژ بۆ جهئينانا وان، هەر وەكو خودێ د قورئانا خۆ يا پيروزدا دبێژيت ( لا يكلف الله نفسا الإ وسعها – خودێ هەر كەسەكى ژ بارێ وى زێدەتر لێ ناكەت ) ، ڤێجا هەر كەسەكێ بڤێت خێرێن مەزن بدەست**

خۆ ڤە بینیت بلا ڤان عیباداتان ژ دەستێن خۆ نەکەت ، و هەروەسا موسلمانێ لاواز ئەگەر بڤێت پلێن بلند ب دەستێن خۆڤە بینت ل ڕۆژا قیامەتێ بلا ڤان عیبادەتان ژدەستێن خۆ نەکەت.

بەلێ مخابن هەتا ئەڤان عیبادەتێن ب ساناهی و خێرا وان مەزن، گەلەك موسلمان کاری پێ ناکەن، وسستیا وان یا گەهشتییە وێ پلێ کو نەشێن ڤان عیبادەتان بکەن، بۆ زانین ئەڤ عیبادەتێن کو ئەم دێ دیارکەن دڤان لاپەراندا (إن شاء الله) هەمی ئەو عیبادەتن یێن کو هەمی مرۆڤ دێ شێن بکەن ب دەمەکێ کورت –چەند دەقیقەکا– وبێ کو چ زەحمەتەکێ پێڤە ببینن، بەلکو دێ مرۆڤ یێ ڕوینشتی بیت یان یێ ترومبێلێ د هاژوت یان هەرکارەکێ دی یێ بجھ دئینیت. و ب ڕاستی نەشیانا مرۆڤێ موسلمان

بۆ كرنا ڤان عیبادەتان نە ژبەر هندێیە كو مرۆڤی شیان نینن ڤان عیبادەتان بكەت بەلكو ژكێم باوەریا ( إیمان ) مرۆڤییە .

بەلێ ئەو كەسێ بەهشت بڤێت ونەهێلیت خوشییێن بەهشتێ ژدەستێن خۆ بكەت ئەو دێ ڤان عیبادەتان هەمیان بجهئینیت، و چ جاران وەناكەت كو بەهشتا خودێ بدەتە ب خوشییێن دونیایێ !!

ڤێجا ماشاء اللە بۆ ڤێ دونیایێ وڤی حالێ جحێل تێدا !! ل مالێ بە كارەب نینە یان موەلیدە یێ خرابوویە، و ژمالێ ب دەركەڤە ترومبێل نینە، و خوزی بەس ئەڤە با، ئەز ب خودێ كەم گەلەك جحێلا پارەكێ وەسا نینە كو بشێن خۆ ب خێزان بێخین،  و ژبلی حالێ

وی یێ ئابوری وکوما دەینا ل سەر ملێت وی خۆ دێ بێژی بابێ (دەهـ عەیالانە) !! خودێ هاریکاربیت .

ڤێجا برایێ موسلمان بلا ئارمانجا تە هەردەم یابلند بیت، بلا هەردەم تۆ بزانی ئەڤ دونیایە نە ئارمانجا تەیە بەلکو وەسیلەکە بۆ تە دا تۆ بەهشتێ بریێکا ڤێ دونیایێ ب دەستێ خۆڤە بینی ، ئەو ژی بکرنا عیبادەتان و زکرێ خودێ ... هتد .

برایێ من ئەز بۆ خودێ گەلەك حەشتە دکەم ، و ژبەر ڤێ حەژێ کرنێ من بۆ برایێ خۆ چەند عیبادەتێن ب ساناهی یێن کومکرین دا بۆ برایێ من ببنە پشتەڤان ل رۆژەکا وەسا کو دایك و باب بۆ مرۆڤی نەبنە پشتەڤان. و من ئەڤ

**کاره یێن کومکرین دڤێ پەرتوکێدا، و من ناڤێ و نیشانێن وێ یێن کرینە ( گرێبەستێن فەیدەبووی )؛ و مەرەما من ژ ڤێ چەندێ ئەوە کو بازرگانییا دروست ئەوە، ئەوا مرۆڤ دگەل خودێ دکەت، چونکو ئەڤێ بازرگانییێ چ جاران خوسارەتی تێدانینە ب ئاناهییا خودێ، و هەروەسا من چ بابەت شروڤەکرینە؛ ژ بەر کو دا بابەت درێژ نەبیت و پەرتوك ژی یا بەرفرەھ نەبیت، تێنەبیت بابەتێ زکرێ خودێ من چەند رێز یێن ل سەر خێر و بەهایێ زکرێ خودێ نڤێسایین ل دویفدا من چەند زکرێن خێرا وان گەلەك مەزن یێن بۆ برایێ خۆ کومکرین؛ چونکو ب دیتنا من زکرێ خودێ ژ کارێن ب ساناهینە بەلێ خێرا وان گەلەك یا مەزنە .**

ل دوماهییێ ئەز دوعا ژخودێ دکەم کۆ ئیخلاسێ ب رزقێ مە بکەت د گوتن و کریارێن مە دا ومە بکەتە دەرگەهێ خێرێ بۆ خەلکەکی . آمـــــــــــــــــین

وصلى الله وسلم وبارك على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين ...

حەژێکەرێ تە بۆ خودێ /

أبو بكر كوجر

١٤٣٢هـ / ٢٠١١م

## باوەرييێ ب خودێ بينه و چ هەڤپشكا بۆ چێنەكە دێ چييه بەهشتێ

جابرێ كورێ عەبدوللاى خودێ ژ وى و بابێ وى رازيـبيت گۆت : زەلامەك هاته دەڤ پێغەمبەرى سلاڤ لێ بن گۆتێ : يا پێغەمبەرێ خودێ ئەوچ هەردوو سالوخەتن مرۆڤ پێ دچيته بەهشتێ يان ئاگرى ، پێغەمبەرى سلاڤ لێ بن گۆت : ( مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ وَمَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ النَّارَ ). ئيمامێ موسلم ئەڤ حەديسه يا ڤەگوهاستى .

هەركەسەكێ بمريت وچ هەڤپشكا بۆ خودێ چێ نەكەت دێ چيته بەهشتێ ، و هەركەسێ

بمریت و هەڤپشکا بۆ خودێ چێ کەت دێ چیتە ئاگری .

عەبدوللا کورێ عاسی خودێ ژوی و بابێ رازیبیت گۆت: پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( من أحب أن يزحزح عن النار ويدخل الجنَّة فلتأته منيته وهو يؤمن بالله واليوم الآخر ، وليأت إلى الناس الذي يحب أن يؤتى إليه ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

ئەو کەسێ بڤێت ژ ئاگری خلاسبیت و بچیتە بەهشتێ ، بلا مرن سەردا بهێت و ئەوی باوەری ب خودێ و رۆژا قیامەتێ هەبیت ، و هەروەسا ئەو خێرا بۆ خۆ دڤێت بلا بۆ خەلکی ژی بڤێت ، یان کا چەوا وی

دڤێت خەلك دان وستاندێ دگەل وی بکەن، بلا ئەو ژی وەسا دان وستاندێ دگەل خەلکی بکەت .

بابێ ئەیوبێ خودێ ژێ رازیبیت گۆت : زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆتە پێغەمبەری سلاڤ لێ بن بەرێ من بدە کارەکی من نێزیکی بەهشتێ بکەت و من ژ ئاگری دویر کەت ، پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆتێ : ( تَعْبُدُ اللَّهَ لاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ وَتُؤْتِى الزَّكَاةَ وَتَصِلُ ذَا رَحِمِكَ ) فَلَمَّا أَدْبَرَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– ( إِنْ تَمَسَّكَ بِمَا أُمِرَ بِهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

**عیبادەتا خودێ بتنێ بکە وچ هەڤپشکا بۆ چێنەکە ، و نڤێژا بکە ، وزەکاتا مالێ خۆ بدە ، وسەرەدانا مرۆڤێن خۆ بکە . بابێ ئەیوبی گۆت دەمێ ئەڤ زەلامە ژ دەڤ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن چووی پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت : ئەگەر ئەو تشتێ من فەرمانا وی پێکری بجهبینیت دێ چیتە بەهشتێ .**

---

## زکرێ خودێ

**زکرێ خودێ ژ هەمی عیبادەتان ب ساناهی ترە وسڤك ترە، و دگەل هندێ زکرێ خودێ باشترین عیبادەتە مرۆڤ خۆ پێ نێزیکی خودێ بکەت بشتی عیبادەتێن فەرز**

، و هەروەسا پلێن مرۆڤی پێ بلند دبن ، و گوننەهێن مرۆڤی دهێنە ژێبرن و خودێ کێماسییێن مرۆڤی پێ دڤەشێرێت .

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ : قال رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم ( سَبَقَ الْمُفَرِّدُونَ . قَالُوا وَمَا الْمُفَرِّدُونَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ الذَّاكِرُونَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتُ ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دیاردکەت دڤێ حەدیسێ دا کو مرۆڤێن هەردەم زکر بێژ دێ بەری هەمییان راکەن و چنە بەهشتێ ، و دەمێ سەحابان گوتنە پێغەمبەری سلاڤ لێ بن کینە ( المفردون ) ، پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت : ئەون ئەوێن گەلەك زکرێ خودێ

**دکەن . برایێ موسلمان ئەگەر تۆ بێژی ئەز نزام کیش زکر گەلەکێ بخێرە ، یان کیش زکر دێ ل چ دەم هێتە گوتن؟ . ئەرێ برا ما باش نینە ئەگەر ئەز چێترترین وسڤك ترین وبخێرترین زکری نیشا برایێ خۆ بدەم، ئەوژی (لا اله الإ اللّٰه)**

**پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت: دەمێ نوح سلاڤ لێ بن مرن ب سەردا هاتی وەسیەتەك ل کورێ خۆ کر و دوێ وەسیەتێدا گوتە کورێ خۆ : ئەز فەرمانێ ل تەدکەم ب ( لا اله الإ اللّٰه ) ، پشتی هینگێ گوتێ : کورێ من ئەگەر هەر حەفت ئەسمان دگەل هەر حەفت ئەردان بکەنە درەخکێ تەرازیێدا، و ( لا اله الإ اللّٰه ) بکەنە درەخێدیدا ، دێ ( لا**

اله الإ الله ) گرانتربیت . بنێره پەرتوكا – السلسلة الصحيحة ١ / ١٣٣ – یا ئیمامێ ئەلبانی .

برایێ موسلمان تۆ ب خودێ کەی گوتنا پەیڤا ( لا اله الإ الله ) چەند دەم پێ دڤێت دا مرۆڤ جارەکێ ڤێ پەیڤێ بێژیت! برایێ موسلمان ئەگەر تۆ ڕۆژێ دەقەکێ نەگەلەك !! دەقەکێ بتنێ تەرخان کەی بۆ گوتنا ڤێ پەیڤێ، کێم کێم دێ سیهـ جاران بێژی، دێ برا هزرا خۆبکە خێرەك بۆ تە بهێتە نڤێسین ڕۆژانە، و ئەڤ خێرە هندا مەزنبیت کو سیهـ جاران هندی هەر حەفت ئەسمان و هەر حەفت ئەردانە، ما شاء الله ئەز ب خودێ کەم مرۆڤەك نەبیت کو خودێ ژێستاندبیت

**ئەڤێ خێرێ ژ دەستێ خۆ ناکەت، برا دێ سوزێ بدە ل سەر خۆ کو تۆ ڕۆژانە کێم کێم دەقیقەکێ تەرخان بکەی بۆ گوتنا پەیڤا ( لا اله الإ الله ) .**

**برا ئەز دێ بۆ تە هندەك زکرێن دی ژی بێژم یێن کۆ گوتنا وان ب ساناهی وخێرا وان گەلەك مەزن :-**

**❖عن شدّاد بن أوس – رضي الله عنه – عن النبي ﷺ قال: "سيد الاستغفار أن يقول العبد: اللهـم أنـت ربـي لا إلـه إلا أنـت خلقتنـي، وأنـا عبدك، وأنا على عهدك ووعدك ما استطعت، أعوذ بك من شر ما صنعت ،أبوء لك بنعمتك علـيّ، وأبـوء بـذنبي فـاغفر لـي فإنـه لا يغفـر**

الـذنوب إلا أنـت ، قـال ومـن قالهـا فـي أول النهار موقناً بها فمات من يومه قبل أن يمسي فهو من أهل الجنة ، ومن قالها من الليل وهو موقن بها فمات قبل أن يصبح ؛ فهو من أهل الجنة" ئيمـامىٚ بوخـارى ئـەڤ حەديسـە يـا ڤەگوهاستى .

ماشاء الله بۆ ڤـىٚ خيٚـرا مـەزن و ب سـاناهى، ئانكو ئەوكەسىٚ سپيٚدىٚ بيٚژيت ( اللهم أنت ربي لا إله إلا أنـت خلقتني، وأنـا عبـدك، وأنـا علـى عهـدك ووعـدك مـا استطعت، أعـوذ بـك مـن شـر مـا صـنعت ،أبـوء لـك بنعمتـك علـيّ، وأبوء بذنبي فاغفر لي فإنه لا يغفر الذنوب إلا أنت ) بـاورى پـىٚ هـەبيت و دووىٚ ڕۆژيٚـدا بمريـت بـەرى ببيتـە شـەڤ ئـەو ژ خـەلكىٚ

بەهشتێیە، و هەروەسا ئـەو كەسـێ ب شـەڤێ بێژیت و باوەری پێ هەبیت وب شەڤ بمریت بەری ببیتە سپێدە ئـەو ژ خـەلكێ بەهشـتێیە، ئەز ب خودێ كەم ئەڤ زكرە مـرۆڤ دێ نـیڤ دەقیقێدا بێژیـت و چ زەحمەتێ پێڤە نابیت، و مـرۆڤ دێ خێرەكـا مـەزن بدەسـتێن خۆڤـە ئینیت، برا تشـتەكێ گەلـەك مەزنـە مـرۆڤ ب گوتنـا زكرەكـێ ببیتـە ژ خـەلكێ بەهشـتێ ، ڤێجا برا بلا هەردەم وەكی تۆ ژ خـەو ڕادبـی ئێكسەر ڤی زكری بێـژە ، تـۆ نزانـی كـا دێ شەڤ ب سەر تەدا هێت یان نە .

❖ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ( مَنْ قَالَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَأَنَّ عِيسَى

عَبْدُ اللَّهِ وَابْنُ أَمَتِهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ وَأَنَّ الْجَنَّةَ حَقٌّ وَأَنَّ النَّارَ حَقٌّ أَدْخَلَهُ اللَّهُ مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةِ شَاءَ ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت: ئەو کەسێ بێژیت (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَأَنَّ عِيسَى عَبْدُ اللَّهِ وَابْنُ أَمَتِهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ وَأَنَّ الْجَنَّةَ حَقٌّ وَأَنَّ النَّارَ حَقٌّ ) خودێ دێ وی بەتە بەهشتێ ب هەر دەرگەهێ بڤێت ژ هەر هەشت دەرگەهێن بەهشتێ .

❖ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ( مَنْ اسْتَغْفَرَ لِلْمُؤْمِنِيْنَ وَالمُؤْمِنَاتِ كَتَبَ اللّٰهُ لَهُ

بِكُلِ مُؤمِنٍ وَمُؤمِنَةٍ حَسَنَة) ئیمامێ تەبەرانی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی و ئیمامێ ئەلبانی یا باش کری د - صحیح الجامع-دا ژمارە ( ٦٠٢٦ ) .

پێغەمبەری سلاڤ لێ بن دبێژیت: ئەو کەسێ داخازا ژێبرنا گونەهان بۆ موسلمانان بکەت خودێ دێ پێش هەر موسلمانەکێ ڤە خێرکێ بۆ نڤیسیت، برا تۆ دزانی چەند موسلمان ئەڤرو ل سەر ڕوییێ ئەردی دژین؟

ل دویڤ هەژمارێن نیودەولەتی، هەژمارا موسلمانان ل سەر روییێ ئەردی (١,٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ئانکو ملیار و پێنج سەد ملیون موسلمانن!! برا تۆ دزانی داخوازا ژێبرنا گونەهان بۆ موسلمانان ژ

خودێ ب چ رەنگ؟!! برا ئەگەر تۆ ب دلەکی تەژی ئیخلاس بێژی ( اللهم اغفر للمؤمنین والمؤمنات ) یان تۆ بێژی ( یارەب تۆ گونەهێن موسلمانان ب غەفرینی ) و خودێ ژ تە قبولکەت دێ بۆ تە ملیار و پێنج سەد ملیون خێر هێنە نڤێسین!!

❖ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت: دوو پەیڤن لسەر ئەزمانی دسڤکن ، گرانن دتەرازیێدا ، خوشتڤینە لدەڤ خودێ (الرحمن) ، ئەو ژی ئەڤ

هەر دوو پەیڤەنە (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ)

❖ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لَأَنْ أَقُولَ سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت: ئەگەر ئەز بێژم (سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّه أَكْبَرُ) خوشتڤی ترن بۆ من ژ هەمی تشتێن تاڤ لێدەرکەتی ، ومەرەما پێغەمبەری سلاڤ لێ بن دونیایە ب هەمی زینەت و خوشیێن خۆ ڤە .

❖قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ وَكُتِبَ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ وَكَانَتْ لَهُ حِرْزًا مِنْ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ إِلَّا رَجُلٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْهُ) ئیمامێ بوخاری و موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت : ئەو کەسێ سەد جاران د ڕۆژێدا بێژیت ( لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ) ، هەر وەکو دەھ عەبد ئازا کرین ، وسەد خێر دێ بۆ وی هێنە

**نڤێسین ، وسەد گونەهێن وی دێ هێنە ژێبرن ، و دێ بۆ وی بیتە پاریزگەر ژ شەیتانی د ڕۆژا ویدا هەتا شەڤ سەردا بهێت ، وکەس ناهێت کو تشتەکێ باشتر ژ یاوی ئیناتبیت ل رۆژا قیامەتێ ، ژ بلی ئێکێ کو بتر ژ وی ئەڤ زکرە گوتبیت .**

**❖قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكْسِبَ كُلَّ يَوْمٍ أَلْفَ حَسَنَةٍ فَسَأَلَهُ سَائِلٌ مِنْ جُلَسَائِهِ كَيْفَ يَكْسِبُ أَحَدُنَا أَلْفَ حَسَنَةٍ قَالَ يُسَبِّحُ مِائَةَ تَسْبِيحَةٍ فَيُكْتَبُ لَهُ أَلْفُ حَسَنَةٍ أَوْ يُحَطُّ عَنْهُ أَلْفُ خَطِيئَةٍ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .**

**پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت: ما ئێك ژهەوە نەشێت هەر ڕۆژ هزار خێران بدەستێن خۆڤە بینیت ، ئینا ئێکێ ڕوینشتی ل دەڤ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت: دێ چەوا ئێك ژمە هزار خێران بدەستێن خۆڤە ئینیت ، پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت: بلا سەد تەسبیحان بکەت ، دێ هزار خێر بۆ وی هێنە نڤیسین ، یان ژی هزار گونەهێن وی دێ هێنە ژێبرن .**

**❖قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ( مَا مِنْ مُسْلِمٍ أَوْ إِنْسَانٍ أَوْ عَبْدٍ يَقُولُ حِينَ يُمْسِي وَحِينَ يُصْبِحُ رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ صلى الله عليه وسلم نَبِيًّا إِلَّا كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ يُرْضِيَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ) ئبن**

**ماجەی ئەڤ حەدیسە یا باش کری و هەروەسا ئبن باز ژی ئەڤ حەدیسە یا باش کری .**

**پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت : نینە موسلمانەك یان مرۆڤەك یان عەبدەك بێژیت دەمێ سپێدە سەردا بهێت یان ژی شەڤ سەردا بهێت ( رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ صلى الله عليه وسلم نَبِيًّا ) سێ جاران ، ئیلا خودێ دێ سوزا خۆ بجه ئینیت دگەل وی ، کۆ وی رازی کەت ل رۆژا قیامەتێ .**

**❖قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ( مَنْ دَخَلَ السُّوقَ فَقَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ حَيٌّ لَا يَمُوتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ**

**شَيْءٍ قَدِيرٌ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ حَسَنَةٍ وَمَحَا عَنْهُ أَلْفَ أَلْفِ سَيِّئَةٍ وَرَفَعَ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ دَرَجَةٍ ) ئيمامێ تورمزی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی و ئیمامێ ئەلبانی یا باش کری د– صحیح الترغیب والترهیب– دا ژمارە ( ١٦٩٤ ) .**

**پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت: ئەو کەسێ بچیتە د ناڤ بازاریدا ( سویکێ دا ) وبێژیت (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ حَيٌّ لَا يَمُوتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ) ، دێ هزار هزار خێر بۆ وی هێنە نڤێسین ، و هزار هزار گونهێن وی دێ هێنە ژێبرن ، و هزار**

**هزار پلان – درجة – دێ هێته بلند كرن .**
**(هزار هزار ئانكو مليون ) .**

**❖قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ( مَنْ صَلَّى عَلَيَّ ثَلاثَاً صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ عَشَرَ مَرَّاتٍ وَبَنَى لَهُ بَيْتَاً فِي الجَنَّة ) ئيمامێ بەغەوى ئەڤ حەديسە يا دروست كرى د پەرتوكا – شرح السنه– دا .**

**پێغەمبەرى سلاڤ لێ بن گوت: ئەو كەسێ سێ جاران سلاڤان ل من بكەت خودێ دێ دەه جاران سلاڤان لێ كەت، وخانيەكێ بۆ وى ل بەهشتێ ئاڤا كەت، وسلاڤێن خودێ دلوڤانييە بۆ مرۆڤێ موسلمان .**

**❖قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ( مَنْ قَرَأَ آيَةُ الكُرْسِي فِي دُبُرِ كُلِ صَلاةٍ مَكْتُوْبَةٍ لَمْ**

**يَمْنَعْهُ مِنْ دُخُوْلِ الجَنَّةِ إِلَّا أَنْ يَمُوْت ) ئيمامێ نەسائی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی و ئیمامێ ئەلبانی یا دروست کری د- صحيح الجامع- دا ژمارە ( ٦٤٦٤ ) .**

**پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت: ئەو کەسێ ئایەتا کورسی بخوینیت ل پشتی هەر نڤێژەکا فەرز ، چ ئاستەنگ د ناڤبەرا وی وبەهەشتێدا نینن ژ بلی مرنێ، ئانکو ئەگەر مرن ب سەردا هات دێ چیتە بەهەشتێ .**

❖ **قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ( ما منكم من أحد يتوضأ فيبلغ ( أو فيسبغ ) الوضوء ثم يقول : أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، وأن محمدا عبده ورسوله إلا فتحت له أبواب الجنة الثمانية ، يدخل من**

أيها شاء ) ئيمامێ موسلم ئەڤ حەديسە يا ڤەگوهاستى .

هەر موسلمانەك ژ هەوە دەستنڤێژێ بگريت ب دورست و تەمامى، وپشتى هينگێ بێژيت : أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، وأن محمدا عبده ورسوله . دێ هەر هەشت دەرگەهێن بەهشتێ بۆ وى ڤەبن ، و دێ دوى دەرگەهێ بەهشتێڕا چيت يێ وى بڤێت .

❖ عەبدوللا كورێ عەمرى خودێ ژوى وبابێ وى رازيبيت گۆت پێغەمبەرى سلاڤ لێ بن گۆت: ( خَصْلَتَانِ أَوْ خَلَّتَانِ لاَ يُحَافِظُ عَلَيْهِمَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ هُمَا يَسِيرٌ وَمَنْ يَعْمَلُ بِهِمَا قَلِيلٌ يُسَبِّحُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ

عَشْرًا وَيَحْمَدُ عَشْرًا وَيُكَبِّرُ عَشْرًا فَذَلِكَ خَمْسُونَ وَمِائَةٌ بِاللِّسَانِ وَأَلْفٌ وَخَمْسُمِائَةٍ فِى الْمِيزَانِ وَيُكَبِّرُ أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ وَيَحْمَدُ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ وَيُسَبِّحُ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ فَذَلِكَ مِائَةٌ بِاللِّسَانِ وَأَلْفٌ فِى الْمِيزَانِ ).
عەبدوللا كورێ عەمری گۆت: فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– يَعْقِدُهَا بِيَدِهِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ هُمَا يَسِيرٌ وَمَنْ يَعْمَلُ بِهِمَا قَلِيلٌ قَالَ ( يَأْتِى أَحَدَكُمْ – يَعْنِى الشَّيْطَانَ – فِى مَنَامِهِ فَيُنَوِّمُهُ قَبْلَ أَنْ يَقُولَهُ وَيَأْتِيهِ فِى صَلاَتِهِ فَيُذَكِّرُهُ حَاجَةً قَبْلَ أَنْ يَقُولَهَا ) ئیمامێ تورمزی و ئەبو داوود و نەسائی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی وئیمامێ ئەلبانی یا

دروست كرى د– صحيح الجامع– دا ژماره (٣٢٣٠ )

دوو سالوخەت يێن هەين، نينە موسلمانەك پاريزگرتنىٚ ل سەر بكەت ئيلا دىٚ چيتە بەهشتىٚ ، و ئەو ب ساناهينە و كارپێكرن ب وانا پيچەكە، پشتى هەر نڤێژەكىٚ دىٚ دەه تەسبيحاتا دىٚ دەت ( سبحان الله ) ، ودەه جاران حمدىٚ دەت ( الحمد لله ) ، ودەه جاران تەكبيراتا دىٚ دەت ( الله أكبر ) ، كومكەرىٚ وان پشتى هەمى نڤێژا دبيتە ( ١٥٠ ) جار ب ئەزمانى، و ( ١٥٠٠ ) جاران د تەرازيێدا ، و دىٚ سيه و چوار جاران تەكبيراتا ( الله أكبر ) دىٚ دەت دەمىٚ دهێتە سەر جهىٚ خوٚ يىٚ نڤستنىٚ دگەل سيه

وسیٚ تەحمیدان ( الحمد لله ) و سیه وسیٚ تەسبیحان ( سبحان الله ) کۆ کومکەریٚ وان دبیتە ( ١٠٠ ) جار ب ئەزمانی ، و ( ١٠٠٠ ) جاران د ترازییێدا . پشتی هینگیٚ عەبدوللای گۆت من پیێغەمبەر سلاڤ لیٚ بن دیت ئەڤ زکرە د گۆت و ب دەستیێن خۆ د هژمارتن، هندەکا گۆتە پیێغەمبەری سلاڤ لیٚ بن چەوا ب ساناهینە وکارپیێکرن ب وانا پیچەکە ، پیێغەمبەری سلاڤ لیٚ بن گۆت : ئیێك ژ هەوە دهیێتە سەر جهیٚ خۆ یی٘ نڤستنیٚ شەیتان دیٚ رابیت خەوا وی هینیت بەس دا ئەو مرۆڤ ڤی زکریٚ هند ب خیێر نەبیێژیت ، یان ئیێك ژ هەوە نڤیێژا خۆ کر شەیتان دیٚ

ڕابیت شولەکێ هێنیتە بیرا وی دا بەس ڤی زکری ژ بیراوی ببیت و نەبێژیت .

## چاکی دگەل دەیکێ و بابی

بابێ دەردائی خودێ ژێ رازیبیت گۆت: من گوه ل پێغەمبەری بوو سلاڤ لێ بن گۆت: ( الوالد أوسط أبواب الجنَّة، فإن شئت فأضع ذلك الباب أو احفظه ) ئیمامێ تورمزی و ئبن حبانی و حاكمی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی وئیمامێ ئەلبانی یا دروست کری د– صحيح الجامع– دا ژمارە (٧١٤٥) .

بابێ مرۆڤی دەرکەهێ نیڤا بەهشتێیە ، ڤێجا ئەگەر تە بڤێت ئەوی دەرگەهی ژ دەستێ خۆ بکە ، یان ئەوی دەرگەهی ب پارێزە بۆ خۆ

. و پاراستنا ڤى دەرگەهى دێ ب كرنا باشێ بيت دگەل بابێ مرۆڤى و هەروەسا مرۆڤ گوهدانا فەرمانێت وى بكەت دهەمى كاراندا، بەلێ گوننەهـ تێنەبيت .

و هەروەسا موعاويە كورێ جاهيمەى خودێ ژوى وبابێ وى رازيبيت گۆت: جاهيمە چوو دەڤ پێغەمبەرى سلاڤ لێ بن گۆتێ: يا پێغەمبەرێ خودێ من دڤێت ئەز بچمە جيهادێ بەلێ بەرى ئەز بچم من دڤێت ئەز پرسيارا خۆ بتە بكەم بۆ ڤێ چەندێ ( ئانكو چوونا من بۆ جيهادێ ) ، ئينا پێغەمبەرى سلاڤ لێ بن گۆتێ: تە دەيك هەيە ؟ جاهيمەى گۆت: بەلێ ، پێغەمبەرى سلاڤ لێ بن گۆتێ: ل دەڤ دايكا خۆ بە ؛ چونكى

بەهشت یا لدەڤ پیێ ویێ . ئیمامێ ئەحمەد و حاکم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی وئیمامێ ئەلبانی یا باش کری د– صحیح الجامع– دا ژمارە ( ٢٦٠٤) .

## ڕێکا بەهشتیێ بۆ ژنکیێ

بابێ هوریرە خودیێ ژێ رازیبیت گۆت: پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( إذا صلّت المرأة خمسها ، وصامت شهرها ، وحصنت فرجها ، وأطاعت بعلها ، قيل لها: ادخلي الجنَّة من أي ابواب الجنَّة شئت ) ئیمامێ ئبن حبان ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی وئیمامێ ئەلبانی یا دروست کری د– صحیح الجامع– دا ژمارە (٦٦٠ ) .

ئەگەر ژنکێ هەر پێنج نڤێژێن خۆ کرن ، وهەیڤا رەمەزانێ برۆژی بوو ، وخۆ ژ خرابیا دا پاش ( فاحیشێ ) ، و پێگرییێ ب فەرمانێن زەلامێ خۆ بکەت ، ل رۆژا قیامەتێ خودێ دێ بێژیتێ : هەرە بەهشتێ د وی دەرگەهی را ئەوێ تە بڤێت ژ دەرگەهێن بەهشتێ .

## خۆ ژ ڤان رەوشتێن نە باش دویر بێخە دێ چییە بەهشتێ

( ثوبان) خودێ ژێ رازیبیت گۆت: پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( من مات وهو بريء من الكبر والغُلُول والدَّيْن دخل الجنَّة ) ئیمامێ تورمزی و ئبن ماجەی و حاکم و ئبن حبانی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی وئیمامێ

ئەلبانی یا دروست کری د- صحیح سنن الترمذي – دا .

ئەو کەسێ بمریت و ئەو یێ گەردەن ئازابیت ژ مەزناتییێ و غولولێ ( ئەوژی دزیا غەنیمێیە بەری بهێتە دابشکرن ل سەر موسلمانا ) و دەینداریێ، دێ چیتە بەهشتێ.

**راکرنا تشتێ خەلك پێ دئێشیت ل سەر رێیا هاتن و چوونێ .**

راکرنا وی تشتی یێ خەلك پێ دئێشیت وەکی دیتنا بەری یان هەرتشتەکێ بیتە ئاستەنگ بۆ هاتن و چوونا خەلکی ، پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت: ( من رفع حجرا عن الطريق كتب الله له حسنة ، ومن كانت له

حسنة دخل بها الجنة ) . بنێره پەرتوكا – صحيح الجامع ٦٢٦٥– . یا ئیمامێ ئەلبانی

هەركەسەكێ بەرەكی ل سەر رێكەكێ ڕاكەت، خودێ دێ بۆ وی خێرەكێ نڤێسیت ، و ئەو كەسێ خێرك هەبیت دێ چیتە بەهشتێ .

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال : سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول : ( لقد رأيت رجلاً يتقلب في الجنَّة في شجرةٍ قطعها من ظهر الطريق ، كانت تؤذي الناس ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .
بابێ هوریره خودێ ژێ رازیبیت گۆت : من گوه ل پێغەمبەری بوو سلاڤ لێ بن گۆت : من مرۆڤەك دیت خۆ د قولپاند د

بەهشتیێدا، سەرا دارەکێ کۆ دریێکا خەلکیدا بوو وخەلك پێ دئیێشا، ئەوی ڕابو ئەڤ دارە بری .

خۆاندنا قورئانا پیروز .

جابرێ کورێ عەبدوللای خودێ ژوی وبابێ وی رازیبیت گۆت : پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت ( القرآن شافع مشفع، وماحل مصدق، ومن جعله أمامه قاده إلى الجنَّة ، ومن جعله خلفه ساقه إلى النَّار ) ئیمامێ تەبەرانی و ئبن حبانی وبەیهەقی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی وئیمامێ ئەلبانی یا دروست کری د- صحیح الجامع - دا ژمارە ( ٤٤٤٣ ) .

قورئان بەرەڤانەکێ بەرەڤانیا وی قەبوولکریە، وشاهدەکێ راست گویە، و ئەو کەسێ

**قورئانێ بکەتە ئیمام بۆ خۆ– ئانکو لدویڤ فەرمانێت قورئانێ بچیت وکاری پێ بکەت – دێ وی بەتە بەهشتێ، و ئەو کەسێ قورئانێ ل پاشخۆ بهێلیت دێ وی بەتە ئاگری .**

**دەربارەی خێرا خۆاندنا قورئانا پیروز، پێغەمبەری سلاڤ لێ بن دبێژیت: ( من قرأ حرفا من كتاب الله فله حسنة ، والحسنة بعشر أمثالها، لا أقول ألم حرف، ولكن ألف حرف، ولام حرف، وميم حرف ) ئیمامێ تورمزی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی وئیمامێ ئەلبانی یا دروست کری د– السلسلة الصحيحة – دا ژمارە ( ٣٣٢٧ ) .**

هەرکەسەکێ پیتەکێ ژ قورئانا پیروز بخوینیت بۆ وی ب خێرەکێیە، وهەر خێرەك ب دەهـ خێرانە، وئەز نابێژمە هەوە کۆ ( ألم ) ئێك پیتەیە، بەلێ ( ألف ) پیتەکە، و ( لام ) پیتەکە، و ( میم ) پیتەکە. ئانکو خۆاندنا ( ألم ) بتنێ ب سیهـ خێرانە .

برایێ موسلمان تۆ دزانی کۆ ( بسم الله الرحمن الرحیم ) ئەوا دهێتە هژمارتن ئێك ژ ئایەتێن سورەتا فاتیحێ ژ ( ٢٣) پیتان پێك دهێت، ئانکو خۆاندنا وێ بتنێ ب( ٢٣٠ ) خێرانە، وسورەتا فاتیحە ژ ( ١٥٨ ) پیتا پێك دهێت، ئانکو خۆاندنا وێ بتنێ ب( ١٥٨٠ ) خێرانە ، برا تۆ دبینی چەند خێر یێن ژمە چووین ولا حول ولا قوە الا باللە .

**برا تۆ ب خودێ کەی خۆاندنا سورەتا فاتیحە چەند دەم پێدڤێت، گەلەك بلا نیف دەقیقە بیت ، ئەرێ ئەگەر سورەتا فاتیحێ وسورەتا ( قل هو الله أحد ) و سورەتا ( قل أعوذ برب الفلق ) وسورەتا ( قل أعوذ برب الناس ) وئایەتا کورسی وچەندین سورەت و ئایەتێن دی ، مرۆڤ بخۆینیت رۆژانە مرۆڤ دێ چەند خێرێن مەزن بدەستێن خۆڤە ئینیت .**

**ئەرێ باشە ئەگەر مرۆڤ قورئانێ هەمییێ ژبەرکەت و هەردەم ژ بەر مرۆڤ قورئانێ بخۆینیت دێ چەند خێرێن مەزن بدەستێن خۆڤە ئینیت .**

## بەهايێ خێرا سورەت تەبارەك

ئەنەس خودێ ژێ رازيبيت گۆت : پێغەمبەرى سلاڤ لێ بن گۆت : ( سورة من القرآن ما هي إلا ثلاثون آية ، خاصمت عن صاحبها حتى أدخلته الجنة ، وهي سورة تبارك ) ئيمامێ تەبەرانى ئەڤ حەديسە يا ڤەگوهاستى وئيمامێ ئەلبانى يا باش كرى د– صحيح الجامع – دا ژمارە (٣٦٤٤ ) .

ئێك ژ سورەتێن قورئانا پيروز ژ سيه ئايەتان پێك دهێت ، بەرەڤانى ژ خودانێ خۆ كر هەتا برە بەهشتێ ، و ئەو ژى سورەتا تەبارەكە.

## بەهایێ سوجدا قورئانێ

بابێ هورەیرە خودێ ژێ رازیبیت گۆت : پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِي يَقُولُ يَا وَيْلَهُ – وَفِي رِوَايَةِ أَبِي كُرَيْبٍ يَا وَيْلِي – أُمِرَ ابْنُ آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَأَبَيْتُ فَلِيَ النَّارُ ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

ئەگەر کورێ ئادەمی قورئان خواند وگەهشتە ئایەتا سەجدێ وچۆ سوجوودێ، شەیتان دێ خۆڤەدەرکەت و کەتە گری ، وبێژیت وەیل ( مرن یان ژی هندەك دبێژن نەهالەکە ژ نهالێت جەهنەمێ ) بۆ من بیت ، کورێ ئادەمی فەرماناوی هاتە کرن بۆ

سوجدێ وچۆ سوجوودێ بەهشت بۆ وییە ، و فەرمان ل من هاتە کرن بۆ سوجدێ و ئەز نە چۆومە سوجوودێ ئاگر بۆ منە .

## سلاڤ و چوونا دەستی .

سلاڤ وچوونا دەستی دەرگەهێ حەژێکرنێ یە دناڤ بەرا موسلماناندا، وئێکە ژ ئەگەرێن چوونا مرۆڤی بۆ بەهشتێیە، ژ بەرکو سلاڤ و چوونا دەستی دەلیلە بۆ رێکا ڕاست وسلامەتیا دلان، پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت: ( لا تدخلوا الجنة حتى تؤمنوا ، ولا تؤمنوا حتى تحابوا، أولا أدلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم؟ أفشوا السلام بينكم ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

هوین ناچنە بەهشتێ هەتا هوین باوەرییێ نەئینن ، وهوین باوەرییێ نائینن هەتا هوین حەژ ئێك و دوو نەكەن ، ئەرێ ما ئەز بەرێ هەوە نەدەمە تشتەكێ كۆ هوین بكەن حەژێكرن د ناڤبەرا هەوەدا پەیداببیت؟ سلاڤێ د ناڤبەرا ئێك و دوو بلاڤ بكەن .

وپێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت ( ما من مسلمان یلتقیان فیتصافحان إلا غفر لهما قبل أن یفترقا ) ئیمامێ ئەبو داوود ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی وئیمامێ ئەلبانی یا باش كری د- السلسلة الصحیحة- دا ژمارە ( ٥٢٥ ).

نینه دوو موسلمان ئێك ودوو ببینن وبچنه دەستێ ئێك ودوو ئیلا دێ گونەهێن وان هێنه ژێبرنێ بەری ژ دەڤ ئێك ودوو بچن .

## خۆاندنا سێكا قورئانێ د دەقیقەكێدا .

مرۆڤ د دەقیقەكێدا دشێت سێكا قورئانێ بخۆینیت ، پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت: ( قل هو الله أحد تعدل ثلث القرآن ) رواه مسلم . خۆاندنا سورەتا ( قل هو الله أحد ) جارەكێ بەرامبەری سێكا قورئانێ یە . ئانكو قورئانێ بكە سێ پشك ، و سورەتا ( قل هو الله أحد ) خێرا وێ هندی ئێك ژوان پشكانه.

## دەستڤەئینانا دەھ سەلەواتێن خودێ د دقیقێدا

تۆ دشێ د دەقیقەکێدا دەھ سلاڤێن خودێ بدەستێن خۆڤە بینی وسلاڤێن خودێ دلوڤانیە ، پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت ( من صلى عليّ صلاة صلّى الله عليه بها عشراً ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوھاستی .

ھەرکەسەکێ جارەکێ سلاڤان ل من بکەت خودێ دێ دەھ جاران سلاڤان لێ کەت . زکرەکێ ب ساناھی وخێرەکا مەزن کۆ خودێ ب مەزنیا خۆڤە ( جل جلاله ) سلاڤان ل مرۆڤی بکەت ونە جارەکێ ژی دەھ جاران !! ، دەھ جاران دلوڤانیا خودێ

**ل مرۆڤی بهێته کرن !! . برا تۆ دزانی سلاڤا ل سەر پێغەمبەری سلاڤ لێ بن چەند ب ساناهی یە . هندەك سەحابان گوتە پێغەمبەری سلاڤ لێ بن ئەم چەوا سلاڤان ل تە بکەن ئەی پێغەمبەرێ خودێ ، پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت: بێژن ( اللهم صلي على محمد وعلى آل محمد كما صليت على آل إبراهيم إنك حميد مجيد ، اللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على آل إبراهيم إنك حميد مجيد ) متفق عليه .**

**بلا گەلەك گەلەك ئەڤ سلاڤە نیف دەقیقێ مرۆڤ مینیتە پێڤە، ئەرێ ئەگەر مرۆڤ ڕۆژێ دەققەکێ تەرخان بکەت بۆ ڤێ سلاڤێ ما گەلەکە برا ، ئەگەر مرۆڤ د دەقیقێدا دوو**

جاران ڤێ سلاڤێ ل پێغەمبەری سلاڤ لێ بن بکەت وبیست سلاڤێن خودێ بدەستێن خۆڤە بینیت مانە گەلەکە بەرامبەری وی دەمژمێرێ کۆ مرۆڤ بگوتنا ڤێ سلاڤێ ڤە دبورینیت .

## بەهایێ بهێنفرەهییێ (الصبر)

بابێ هوریرە خودێ ژێ رازیبیت حەدیسەکێ ژکیس دەڤێ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن ڤەدگوهێزیت دبێژیت: پێغەمبەری سلاڤ لێ گۆت: ( يقول الله تعالى : ما لعبدي المؤمن عندي جزاء إذا قبضت صفيه من أهل الدنيا ، ثم احتسبه إلا الجنَّة ) ئیمامێ بوخاری ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

خودێ د بێژیت: عەبدێ منێ موسلمان چ جزا لدەڤ من نینن ئەگەر من خۆشتڤییێ وی مراند و ئەوی بۆ خۆ ب خێر حیسابکر ئیلا بەهشت .

و هەروەسا بابێ موسایێ ئەشعەری خودێ ژێ رازیببیت حەدیسەکێ ژ کیس دەڤێ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن ڤەدگوهێزیت دبێژیت: پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( إذا مات ولد العبد قال الله لملائكته: قبضتم ولد عبدى؟ فيقولون: نعم ، فيقول: قبضتم ثمرة فؤاده؟ فيقولون: نعم ، فيقول: ماذا قال عبدي؟ فيقولون: حمدك واسترجع ، فيقول الله: ابنو لعبدي بيتا في الجنَّة ، وسموه: بيت الحمد ) ئیمامێ تورمزی و ئبن حبانی ئەڤ

**حەدیسە یا ڤەگوهاستی وئیمامێ ئەلبانی یا باش کری د– صحیح الجامع – دا ژمارە ( ٧٩٥ ).**

**ئەگەر کورێ عەبدەکێ مر ، خودێ دێ بێژیتە مەلائیکەتان: هەوە ڕوحا کورێ عەبدێ من ستاند؟ ( وخودێ ژوان چێتر دزانیت ) دێ بێژنێ: بەلێ ، خودێ دێ بێژیتە وان: هەوە فێقییێ دلێ عەبدێ من ستاند؟ دێ بێژنێ: بەلێ ، خودێ دێ بێژیتە وان عەبدێ من چ گۆت؟ دێ بێژنێ: حەمدا تەکر و گۆت إنا لله وإنا إليه راجعون . خودێ دێ بێژیتە وان: خانیەکێ ل بەهشتێ بۆ عەبدێ من ئاڤاکەن ، وناڤێ وی بکەنە خانییێ حەمدێ .**

## سەرەدانا مرۆڤێ نەخوش .

دەربارەی سەرەدانا موسلمانێ نەخوش ، بابێ هوریرە خودێ ژێ رازیبیت گۆت: پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( من عاد مريضاً أو زار أخاً له في الله ، ناداه مناد : أن طبت وطاب ممشاك ، وتبوَّأت من الجنَّة منزلاً ) ئیمامێ تورمزی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی وئیمامێ ئەلبانی یا باش کری د- صحيح سنن الترمذي – دا ژمارە ( ٧٩٥ ) .

ئەو کەسێ سەرا نەخۆشەکی بدەت یان سەرا برایێ خۆ یێ موسلمان بدەت ، مەلائیکەتك دێ گازی کەتێ چوونا تە تەنا بیت وتەژی

**خێر بيت ، وته بۆ خۆ جهەك ل بەهشتێ هلبژارت .**

**و هەروەسا پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژيت: (ما من مسلم يعود مسلما إلا يبعث الله إليه سبعين ألف ملك يصلون عليه في أي ساعات النهار حتى يمسي وفي أي ساعات الليل حتى يصبح ) ئيمامێ ئبن حبانى ئەڤ حەديسە يا ڤەگوهاستى وئيمامێ ئەلبانى يا دروست كرى د– صحيح الترغيب والترهيب – دا .**

**هەر موسلمانەك بچيتە سەرەدانا موسلمانەكێ نەخوش ئيلا خودێ دێ حەفتێ هزار مەلائيكەتان فرێكەت كۆ سەلەواتان بدەنە سەر وى مرۆڤێ چوويە سەرەدانا برايێ خۆ يێ موسلمان ، ژ هەر دەمەكى ژ دەمێن**

سپێدێ هەتا شەڤ سەردابهێت، یان ژ هەر دەمەکی ژ دەمێن شەڤێ هەتا سپێدە سەردابهێت، ئانكو ئەگەر سپێدێ چوو سەرەدانا برایێ خۆ یێ نەخوش دێ ئەو حەفتێ هزار مەلائیکەت سەلەواتان ل وی کەن هەتا شەڤ سەردا بهێت ، وهەروەسا ب شەڤێ دێ سەلەواتان ل وی کەن هەتا ڕۆژ سەردا بهێت . و سەلەواتێن مەلائیکەتان دوعا ژێبرنا گوننەهانە بۆ مرۆڤی .

برایێ موسلمان ما کێمە حەفتێ هزار مەلائیکەت بۆ مرۆڤی دوعا ژێبرنا گوننەهان بکەن ب ڕۆژێ هەمییێ هەتا شەڤێ یان ب شەڤێ هەمییێ هەتا ڕۆژێ .

## خێرا زکرێ دەستنڤێژێ

**عومەرێ کورێ خەتابی خودێ ژێ رازیبیت گۆت : پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت : (من توضأ فأحسن الوضوء ، ثم قال : أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، وأن محمدا عبده ورسوله ، اللهم اجعلني من التوابين ، واجعلني من المتطهرين ، فتحت له ثمانية أبواب الجنَّة ، يدخل من أيها شاء ) ئیمامێ موسلم و تورمزی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .**

**هەر کەسەکێ باش دەستنڤێژێ بگریت ، وپشتی هینگێ بێژیت : أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، وأن محمدا عبده ورسوله ، اللهم اجعلني من التوابين ، واجعلني**

من المتطهرين . دێ هەشت دەرگەهێن بەهشتێ بۆ وی ڤەبن ، ودێ دوی دەرگەهێ بەهشتێڕا چیت یێ وی بڤێت .

## خێرا سونەتا دەستنڤێژێ

عوقبە کورێ عامری خودێ ژێ رازیبیت گۆت: پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( ما من مسلم يتوضأ فيحسن وضوءه، ثم يقوم، فيصلي ركعتين، مقبل عليهما بقلبه ووجهه، إلا وجبت له الجنَّة ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

هەر موسلمانەکێ باش دەستنڤێژا خۆ بگریت، پشتی هینگێ ڕابیت دوو ڕەکعەتان بکەت ب دل و سەروچاڤێن خۆ بچیتێ، ئیلا بەهشت دێ بۆ وی بیتە ئەرك .

## خێرا بانگدانێ

عەبدوللا كورێ عومەرێ خودێ ژوی وبابێ رازیبیت گۆت : پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت : ( من أذن ثنتي عشرة سنة وجبت له الجنَّة ، وكتب له بتأذينه في كل يوم ستين حسنة ، وبكل إقامة ثلاثون حسنة ) ئیمامێ ئبن ماجەی و بەیهەقی و حاكمی و تەبەرانی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی وئیمامێ ئەلبانی یا دروست كری د- صحيح الجامع – دا ژمارە (٦٠٠٢ ).

ئەو كەسێ دوازدە سالان بانگی بدەت بەهشت دێ بۆ وی بیتە ئەرك ، وهەر رۆژ پێش بانگەكیڤە دێ شێست خێر بۆ وی

هێنه نڤێسین ، و پێش هەر قامەتەکێ ڤە سیه خێر دێ بۆ وی هێنه نڤێسین .

## بەرسڤدانا موئەزنی .

د حەدیسێن دروستدا یاهاتی مرۆڤ دگەل موئەزنی دوو بارەبکەت و دوعا بۆ خۆ بکەت گونەهێن مرۆڤی دێ هێنه ژێبرن ، پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت: ( من قال حين يسمع المؤذن : أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، وأن محمد عبده ورسوله ، رضيت بالله ربا وبمحمد رسولا ، وبالإسلام دينا . غفر له ذنبه ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

هەرکەسەکێ دەمێ دەنگێ بانگی گوه لێ بیت بێژیت : ( أشهد أن لا إله إلا الله وحده

**لا شريك له ، وأن محمد عبده ورسوله ، رضيت بالله ربا وبمحمد رسولا ، وبالإسلام دينا ) گوننەهێن وی دێ هێنە ژێبرن . زکرەکێ ب ساناهی کۆ مرۆڤ چ زەحمەتێ پێڤە نابیت وخێرەکا مەزن بدەستێن خۆڤە بینیت کۆ گوننەهێن مرۆڤی بهێنە ژێبرن .**

**هەروەسا پێغەمبەری سلاڤ لێ بن یا گوتی ئەو کەسێ هەمی بانگی وەکی موئەزنی دووبارەکەت ، بەلێ بتنێ نەبیت وەکی موئەزن دبێژیت ( حي على الصلاة ) و ( حي على الفلاح ) مرۆڤ بێژیت ( لا حول ولا قوة إلا بالله ) ، وپشی دووماهی هاتنا بانگی مرۆڤ سلاڤان ل پێغەمبەری بکەت و پشتی هنگێ داخازا ( وسیلة ) بۆ پێغەمبەری**

سلاڤ لێ بن بکەت دێ مرۆڤ بەرەڤانیا پێغەمبەری سلاڤ لێ بن بدەستێن خۆڤە ئینیت ل ڕۆژا قیامەتێ . وداخازا وەسیلێ دێ بڤی رەنگی بیت ( اللهم صلي على محمد وعلى آل محمد كما صليت على آل إبراهيم إنك حميد مجيد ، اللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على آل إبراهيم إنك حميد مجيد ) پشتی سلاڤێ دێ بێژی ( اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة ، آت محمداً الوسيلة والفضيلة وابعثه اللهم مقاما محموداً الذي وعدته ) . و ( إنك لا تخلف الميعاد ) ئەڤ رستە ب هندەك رێکێن لاواز یا هاتی ڤەگوهاستن ژپێغەمبەری سلاڤ لێ بن هەروەکۆ زانایێن حەدیسێ دیارکری ، ڤێجا

یا دروست ئەوە مرۆڤ ویٚ رستیٚ ( إنك لا تخلف الميعاد ) نە بیٚژیت . ل سەر ڤی بابەتی بنیٚرە ( سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة ١١/ ٢٩٣ ) یا ئیمامیٚ ئەلبانی.

## بەهاییٚ گرتنا دەستنڤیٚژیٚ و ئیٚکسەر چوون بۆ مزگەفتیٚ

برا تۆ دزانی ئەگەر تە گوهـ ل بانگی بوو و تۆ ئیٚکسەر دەستنڤیٚژیٚ بگری و بچیە مزگەفتیٚ و نڤیٚژا خۆ یا فەرز ب جەماعەت بکەی خیٚرا تە وەکی خیٚرا حەجحەیەکیٚیە، پیٚغەمبەر سلاڤ لیٚ بن دبیٚژیت: ( من خرج من بيته متطهرا إلى صلاة مكتوبة فأجره أجر الحاج المحرم ) ئیمامیٚ ئەلبانی ئەڤ حەدیسە یا دروست کری . و هەروەسا ئەڤ چەندە بۆ

ژنکێ ژی دهێت ئەگەر نڤێژا خۆ ل مالێ ژی بکەت بەلێ ئینیتاویێ ئەڤ خێرەبیت . برا ب کرنا (٥) نڤێژان د رۆژایێدا تۆ دێ خێرا (٥) حەججان ب دەستێن خۆڤە ئینی .

## خێرا چوونا مزگەفتێ

بایێ هوریرە خودێ ژێ رازیبیت گۆت: پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( من غدا إلى المسجد أو راح أعد الله له في الجنَّة نزلا كلما غدا أو راح ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

ئەو کەسێ بچیتە مزگەفتێ یان ژ مزگەفتێ بزڤریت خودێ دێ بۆ وی جهەکی ل بەهشتێ ئامادەکەت هەرگاڤەکا بچیتە مزگەفتێ یان ژ مزگەفتێ بزڤریت .

## بەهایێ كرنا نڤێژان

برا هندیكە نڤێژە ستوینا ئیسلامێیە، وئێكەمین پرسیار ل رۆژا قیامەتێ دێ ژ مروڤی هێتە كرن دەربارەی نڤێژێیە.

عوبادەی كورێ صامتی خودێ ژێ رازیبیت گۆت : پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( خَمْسُ صَلَوَاتٍ كَتَبَهُنَّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى عِبَادِهِ ، فَمَنْ وَفَى بِهِنَّ لَمْ يُضَيِّعْهُنَّ كَانَ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ عَهْدٌ أَنْ يَغْفِرَ لَهُ وَأَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ ، وَمَنْ لَمْ يُوَافِ بِهِنَّ اسْتِخْفَافًا بِحَقِّهِنَّ فَلَيْسَ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ عَهْدٌ ، إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ ) ئیمامێ ئبن ماجەی و بەیهەقی و ئبن حبانی و ئەحمەدی و ئەبو داوودی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی وئیمامێ ئەلبانی یا دروست

**كرى د– صحيح الجامع – دا ژماره (٣٢٤٣ ).**

**پێنج نڤێژن خودێ يێن ل سەر عەبدان نڤێسين، ئەو كەسێ هەر پێنج نڤێژان بكەت وچ ژوان نڤێژان ژ دەست نەدەت و كێماسى ب ماڤێ وانا نەكەت، ئەوى پەيمانەك يا لدەڤ خودێ هەى كۆ وى ببيتە بەهشتێ ، و ئەو كەسێ ڤان نڤێژان ژ دەست بدەت ئەوى چ پەيمان لدەڤ خودێ نينن ، ئەگەر خودێ ڤيبا دێ وى عەزابدەت ، وئەگەر ڤيبا دێ بۆ وى غەفرينيت .**

## ئەنجامدانا نڤێژا عەیشا و سپێدێ ب جەماعەت .

عوسمان کورێ عەفانی ، خودێ ژێ ڕازیبیت، دبێژیت پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت: ( مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ كَانَ كَقِيَامِ نِصْفِ لَيْلَةٍ ، وَمَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ وَالْفَجْرَ فِي جَمَاعَةٍ كَانَ كَقِيَامِ لَيْلَة ) ئەڤ حەدیسە یا هاتیە ڤەگوهاستن ژلایێ ئیمامێ مالك (٣٧١) و ئیمامێ ئەحمەد د–الفتح الرباني– دا(١٦٨/٥) و موسلم (٦٥٦) و تورمزی (٢٢١) و ئەبو داوودی (٥٥٥) و دارەمی (١٢٢٤) .

ئەو کەسێ نڤێژا عەیشا ب جەماعەت بکەت هەر وەکو ئەوی نیڤەکا شەڤێ ب عیبادەتیڤە

بوراندی ، و ئەو کەسێ نڤێژا عەیشا و سپێدێ ب جەماعەت بکەت هەر وەکو ئەوی هەمی شەڤ ب عیبادەتیڤە بوراندی .

## ئەنجامدانا نڤێژا سپێدێ و ئێڤاری

بابێ موسایێ ئەشعەری خودێ ژێ رازیبیت گۆت : پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت : ( من صلى البردين دخل الجنَّة ) ئیمامێ بوخاری و موسلمی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

ئەو کەسێ نڤێژا سپێدێ و ئێڤاری بکەت دێ چیتە بەهشتێ .

## ئەنجامدانا چار رەکعەتان بەری نڤێژا نیڤرۆ .

بابێ سالحی رەحمەتێن خودێ لێ بن دبێژیت پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت : ( أَرْبَعُ رَكَعَاتٍ

قَبْلَ الظُّهْرِ يَعْدِلْنَ بِصَلاَةِ السَّحَرِ ) ئبن شەیبەی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی د – مصنفه– (٥٩٤٠) وئیمامێ ئەلبانی ئەڤ حەدیسە یا باش کری د–السلسلة الصحیحة–دا (١٤٣١). خێرا چار رەکعەتێن بەری نڤێژا نیڤرۆ هندی خێرا نڤێژا ب شەڤە.

هەروەسا ژ سالوخەتێن ڤان چار رەکعەتان کو دەرگەهێن ئەسمانی بۆ دهێنە ڤەکرن . بابێ ئەیوبێ ئەنساری خودێ ژێ رازیبت دبێژیت پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت : ( أربع قبل الظهر تفتح لهن أبواب السماء ) ئەبو داوود یا ڤەگوهاستی (٣١٢٨) و تورمزی د پەرتوکا خودا –الشمائل–دا یا

ڤەگوهاستی و ئیمامێ ئەلبانی د پەرتوكا – صحيح الترغيب والترهيب –دا یا باش كری (٥٨٥) .

## پارێزگەری ل سەر هندەك ڕەوشتێن خوتبێ .

ئەوس كورێ ئەوسێ سەقەفی خودێ ژێ ڕازیبیت گۆت: من گوه ل پێغەمبەری بوو سلاڤ لێ بن گۆت: (مَنْ غَسَّلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاغْتَسَلَ ، ثُمَّ بَكَّرَ وَابْتَكَرَ ، وَمَشَى وَلَمْ يَرْكَبْ ، وَدَنَا مِنْ الإِمَامِ ، فَاسْتَمَعَ وَلَمْ يَلْغُ ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ عَمَلُ سَنَةٍ ؛ أَجْرُ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا) ئیمامێ ئەحمەد د– الفتح الرباني –دا ( ٦ \ ٥١ ) و تورمزی ( ٤٩٦ ) و ئەبو داوود ( ٣٤٥ ) و نەسائی ( ١٣٨١ ) و ئبن ماجەی ( ١٠٨٧ ) و دارەمی ( ١٥٤٧ ) و حاكم (

**١٠٤١ ) و ئبن خوزيمه ( ١٧٥٨ ) و ئيمامێ ئەلبانى يا دروستكرى د – صحيح الجامع – دا ( ٦٤٠٥ ) .**

**ئەو كەسى ڕۆژا خوتبێ سەرێ خۆ بشووت، پشتى هينگێ زوى بچيته مزگەفتێ و ب پێن خۆ بچيته مزگەفتێ نەكو ب سيارى بچيت و خۆ نيزيكێ ئيمامى بكەت وگوهێ خۆ بدەته خوتبێ و نەئاخڤيت هەر پێنگاڤەكا ئەوى بۆ مزگەفتێ هاڤێتى هندى خێرا كارێ سالەكێيه ، ب ڕۆژى گرتنا ڕۆژێن وێڤه و ب ڕابوونا شەڤێن وێ يێن عيبادەتيڤه .**

**تشتێ گەلەك گرنگ ئەوه كو مرۆڤێ موسلمان بزانيت كو ( لغو ) ئەوا پێغەمبەرى سلاڤ لێ بن ، ئەم ژێ داينه پاش و خوتبا**

مرۆڤی پێ بەتال دبیت ، هەمی ئاخڤتنا بخوڤە دگریت، ئانکو ئەگەر تۆ بێژیە هەڤالێ خۆ نەئاخڤە و ئیمامێ خوتبێ دخوینیت ، تۆ لەغویێ دکەی و ئەو کەسێ لەغوێ بکەت خوتبا وی ناهێتە هژمارتن وەکو پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوتی : (وَمَنْ قَالَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ لِصَاحِبِهِ صَهٍ فَقَدْ لَغَا وَمَنْ لَغَا فَلَيْسَ لَهُ فِي جُمُعَتِهِ تِلْكَ شَيْءٌ ) ئەبو داوود ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی ( ٨٨٧ ) و بەیهەقی د– السنن الكبرى –دا ( ٣ \ ٢٢٠ ) . و هەروەسا چێنابیت تۆ خۆ ب تزبیا یان ب موبایلا خۆ ڤە مژویل بکەی و ئیمامێ خوتبێ دخوینیت و ئەو کەسێ ڤی کاری بکەت خوتبا وی ناهێتە هژمارتن وەکو پێغەمبەری

سلاڤ لێ بن گوتی: (مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ فَاسْتَمَعَ وَأَنْصَتَ غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ وَزِيَادَةُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ وَمَنْ مَسَّ الْحَصَى فَقَدْ لَغَا ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی . و دڤێت مرۆڤێ موسلمان ئەڤێ چەندێ ب خەمڤە وەرگریت داکو ژڤێ خێرا مەزن نەهێتە بێ بارکرن.

## بۆ خۆ خانیەکێ ل بەهشتێ ئاڤا بکە .

مرۆڤ دشێت هەر رۆژ خانیەکی بدەستێن خۆڤە بینیت ؛ ئەو ژی برێکا پیتەدانا مرۆڤی ب سوونەتێن رەواتب ، پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت: ( ما من عبد مسلم یصلي لله تعالی کل یوم اثنتي عشرة رکعة تطوعا غیر الفریضة

**إلا بنى الله له بيتا في الجنة ) ئيمامێ موسلم ئەڤ حەديسە يا ڤەگوهاستی .**

**هەر کەسەکێ د رۆژێدا دوازدە رەکعەتان بۆ خودێ بکەت ژبلی فەرزان ئیلا خودێ دێ بۆ وی خانیەکێ د بەهشتیێدا ئاڤاکەت .**

**ئەڤ دوازدە رەکعەتە ژی ئەڤەنە : چار بەری نڤێژا نیڤرۆنە و دوو پشتی وێ نە ، و دوو رەکعەت پشتی نڤێژا مەغرەب، و دوو رەکعەت پشتی نڤێژا عەیشا،و دوو رەکعەت بەری نڤێژا سپێدێ .**

**هەر رۆژ خێرا حەججەکێ و عومرەکێ بدەستێن خۆڤە بینە .**

**پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت: ( من صلى الصبح في جماعة ثم قعد يذكر الله حتى تطلع**

الشمس ، ثم صلى ركعتين ، كانت له كأجر حجة وعمرة ، تامة ، تامة ، تامة )ئيمامێ تورمزى ئەڤ حەديسە يا ڤەگوهاستى و ئيمامێ ئەلبانى د پەرتوكا – صحيح الترغيب والترهيب –دا يا باش كرى

ئەوێ نڤێژا سپێدێ بكەت ب جەماعەت ئانكو ل مزگەفتێ ، پشتى هينگێ ما هشيار و نە نڤست و زكرێ خودێ كر ( قورئان خۆاندن يان زكر ) هەتا تاڤ دەركەڤيت، پشتى هينگێ دوو رەكعەتان بكەت، خودێ دێ خێرا حەججەكێ و عومرەكێ دەتێ ب تمامى، ب تمامى، ب تمامى. برا ئەگەر تۆ بێژى ئەز نەشێم هەرۆژ ڤى كارى بكەم ، بلا ئەينييێ تۆ سێ جاران ڤى كارى بكە، ئەگەر

ئەو ژى گەلەك بيت ئەينييێ دوو جاران، ئەگەر ئەو ژى گەلەك بيت هەما ئەينييێ جارەكێ ڤێ خێرا مەزن ژدەستێ خۆ نەكە .
لدوماهييێ دێ بێژمە برايێ خۆ يێ خوشتڤى باش هزرا خۆ بكە بۆ ڤێ خێرێ، چونكو خێرا حەجێ وعومرێ پێكڤە نە تشتەكێ بيچەكە .

## بەهايێ حەججێ و عومرێ

بابێ هوريرە خودێ ژێ رازيبيت گۆت : پێغەمبەرى سلاڤ لێ بن گۆت : ( العمرة إلى العمرة كفارة لما بينهما ، والحج المبرور ليس له جزاء إلا الجنَّة ) ئيمامێ بوخارى و موسلم ئەڤ حەديسە يا ڤەگوهاستى .

عومره بۆ عومرێ گونههێن د ناڤبەرا خۆدا دغەفرینن ، ئانكو ئەگەر مرۆڤ ئەڤ ساله بچیته عومرێ هەتا سالەكا دی پشتی هینگێ جارەكا دی بچیته عومرێ ، ئەڤ هەردوو عومره دێ گونههێن د ناڤبەرا خۆدا غەفرینن . و پشتی هینگێ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت : وحەججا مەبرور ( ئانكو یا قەبولكری ) چ جزا نینن ئیلا بەهشت . خودێ ب رزقێ مە هەمییان بكەت چوونا عومرێ وحەججێ .

## بەهایێ رۆژی گرتنێ

سەهل خودێ ژێ رازیبیت گۆت : پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( إن في الجنة بابا يقال له الريان يدخل منه الصائمون يوم

**القيامة لا يدخل منه أحد غيرهم يقال أين الصائمون فيقومون لا يدخل منه أحد غيرهم فإذا دخلوا أغلق فلن يدخل منه أحد ) ئيمامێ بوخاری و موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .**

**ل بەهشتێ دەرگەهەکێ هەی دبێژنێ ( الريان ) ، مرۆڤێن ڕۆژی گر دوی دەرگەهی ڕا دچنە بەهشتێ ل ڕۆژا قیامەتێ ، و کەس ژ بلی ڕۆژی گرا دوی دەرگەهی ڕا ناچیت ، دێ هێتە گازیکرن ل وێ ڕۆژێ کا مرۆڤێن ڕۆژی گر ؟ دێ مرۆڤێن ڕۆژی گر ڕابن و دوی دەرگەهی ڕا چنە بەهشتێ ، و ئەگەر مرۆڤێن ڕۆژی گر هەمی چوونە ژور دێ دەرگەهـ هێتە گرتن ، وچ کەس پشتی وان ناچیتە بەهشتێ دوی دەرگەهی ڕا .**

## چوار ڕەوشتێن ئاینێ ئیسلامی

عەبدوللا کورێ سەلامی خودێ ژێ رازیبیت گۆت : پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( يا أيها الناس أفشوا السلام ، وأطعمو الطعام ، وصِلُوا الارحام ، وصَلُّوا بالليل والناس نيام ، تدخلوا الجنَّة بسلام ) ئیمامێ تورمزی و ئبن ماجەی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی و ئیمامێ ئەلبانی یا دروست کری د پەرتوکا – صحيح الجامع –دا ژمارە ( ٧٨٦٥ ) .

گەلی خەلکی سلاڤێ بەلاڤبکەن ، و خۆارنێ ژی بدەن ، و سەرەدانا مرۆڤێن خۆ ژی بکەن ، و رابن ب شەڤ نڤێژا بکەن دەمێ

**خەلك نڤستى ، هوين دێ چنە بەهشتێ ب ئێمناهى.**

## چوار كار بۆ چوونا بەهشتێ

**بابێ هوريرە خودێ ژێ رازيبيت گۆت : پێغەمبەرى سلاڤ لێ بن گۆت: ( من أصبح منكم اليوم صائماً؟ ) قال أبو بكر رضي الله عنه : أنا ، قال : ( فمن تبع منكم اليوم جنازة؟) قال أبو بكر رضي الله عنه : أنا ، قال : ( فمن أطعم منكم اليوم مسكينا؟ ) قال أبو بكر رضي الله عنه : أنا ، قال : ( فمن عاد منكم اليوم مريضاً؟ ) قال أبو بكر رضي الله عنه : أنا ، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ( ما اجتمعن في امرئ إلا دخل الجنة ) ئيمامێ موسلم ئەڤ حەديسە يا ڤەگوهاستى .**

کی ژهەوە ئەڤرو ب ڕۆژیـیە؟ ئەبو بەکری خودێ ژێ رازیبیت گۆت: ئەز، پشتی هینگێ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: کێ ژ هەوە ئەڤرو لدویڤ جەنازا مریەکێ چوویە ؟ ئەبو بەکری گۆتێ: ئەز، پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت : کی ژ هەوە ئەڤرو خۆارنەك دایە مرۆڤەکێ مسکین ؟ ئەبو بەکری گۆتێ : من ، پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت : کی ژ هەوە ئەڤرو چوویە سەرەدانا مرۆڤەکێ نەخۆش ؟ ئەبو بەکری گۆتێ : ئەز ، پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت : نینە مرۆڤەك ئەڤ هەر چار کارە ل دەڤ پەیدابن د ڕۆژەکێدا ئیلا دێ چیتە بەهشتێ .

## خێرا داخواز كرنا زانینێ وتایبەت زانستێن ئاینی

بابێ هورەیرە خودێ ژێ رازیبیت گۆت : پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت : ( من سلك طريقاً يلتمس فيه علماً سهل الله له به طريقاً في الجنَّة ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

ئەو كەسێ رێكەكێ بگریت داخوازا زانینێ پێ بكەت، خودێ ژێ دێ بۆ وی ب وێ رێكێ ، رێكەكێ ساناهی كەت بۆ بەهشتێ .

## نەرماتی د كرین و فروتنێدا

حوزیفە كورێ یەمانی خودێ ژوی وی بابێ رازیبیت گۆت : پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( إن رجلاً فيمن كان قبلكم أتاه

**الملك ليقبض روحه ، فقيل له هل عملت من خير ؟ قال : ما أعلم ، قيل له : انظر ، قال ما أعلم شيئاً غير أني كنت أبايع الناس في الدنيا وأجازيهم ، فأنظر الموسر ، وأتجاوز عن المعسر ، فأدخله الله الجنَّة ) ئيمامێ بوخارى و موسلم ئەڤ حەديسە يا ڤەگوهاستى .**

**زەلامەك ژ مللەتێن بەرى هەوە ، ( ملك الموت ) چوو دا ڕوحاوى بستينيت ، گۆتێ تە هندەك كارێن خێرێ كرينە ؟ گۆتێ ئەز نزانم ، گۆتێ : بەرێ خۆ بدە كارێ خۆ كا تە چ خێر هەيە، ئينا ئەوى زەلامى گۆتە ( ملك الموت )ى ئەز چ نزانم ژ بلى هندێ كۆ دەمێ من تشت د فروتنە خەلكى من هاريكاريا وان دكر ، من تشت دفروتنە**

مرۆڤێ پێ چێبیت ومن خۆ لێ دگرت ( ئانکو من تشت دفروتنێ ب دەین ومن خۆ لێ دگرت ) ، و هەروەسا من تشت د فروتنه مرۆڤێ پێ چێنەبیت و ئەز دا وی ئازاکەم ( ئانکو دەمێ من تشت فروتبانه مرۆڤەکێ فەقیر وپێ چێ نەبا پارا بۆ من ب زڤرینیت ئەز دا بۆ وی وان پارا هێلم ) پشتی هینگێ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت : خودێ ئەڤ مرۆڤە ئازاکر و برە بەهشتێ سەرا ڤی کارێ چاك .

## ئەڤان شەش ڕەوشتان ب جهـ بینه پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دێ زەمانێ دەته ته بۆ چوونا بەهەشتێ

عوبادەی کورێ سامتی خودێ ژێ رازیبیت گۆت: پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( أضمنوا لي ستاً من أنفسكم أضمن لكم الجنَّة : اصدقوا إذا حدثتم ، وأوفوا إذا وعدتّم ، و أدوا إذا اؤتمنتم ، واحفظوا فروجكم ، وغضوا أبصاركم ، وكفوا أيديكم ) ئیمامێ ئەحمەد و حاكم و ئبن حبانی ئەڤ حەدیسه یا ڤەگوهاستی . و ئیمامێ ئەلبانی یا باش کری د پەرتوکا – صحيح الجامع –دا ژمارە ( ١٠١٨ ) .

زەمانێ بدەنە من ب شەش تشتا ژ نەفسا خۆ، ئەز دێ زەمانێ دەمە هەوە بۆ بەهشتێ : راستییێ بێژن ئەگەر هوین ئاخفتن ، وسوزا خۆ بجهبینن ئەگەر هەوە سوزدا ، و ئێمانەتا بۆ خۆدانان بزڤرینن ، و عەورەتا خۆ ب پارێزن ژ فاحیشێ وزنایێ ، وچاڤێن خۆ ب پارێزن ژ سەحکرنا حەرام ، و دەستێن خۆ ژ شەرا دویرکەن .

## رێکا بەهشتێ و رێکا ئاگری

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: سئل رسول الله صلى الله عليه وسلم عن أكثر ما يدخل الناس الجنَّة ، فقال: ( تقوى الله وحسن الخلق ) ، وسئل عن أكثر ما يدخل الناس النار ، فقال: ( الفم والفرج ) ئیمامێ

**تورمزی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی و ئیمامێ ئەلبانی یا باش کری د پەرتوکا – صحيح سنن الترمذي –دا .**

**بایێ هوریرە خودێ ژێ رازیبیت گۆت: پرسیار ژ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن هاتە کرن کۆ تشتێ بارا پتر مرۆڤی ببیتە بەهشتێ ؟ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: تەقوا خودێ و رەوشتێ باش ، و هەروەسا پرسیار ژ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن هاتە کرن کۆ تشتێ بارا پتر مرۆڤی ببیتە ئاگری ؟ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: دەڤ ( و مەرەم پێ ئەزمانە ) و عەورەت ( و مەرەم پێ فاحیشە و زنا یە ) .**

## ب گرنژه بۆ برایێ خۆیێ موسلمان وسەدەقەکێ ب دەستێن خۆڤە بینه.

مرۆڤ ب گرنژین ڤه بچیته دەڤ برایێ خۆ یێ موسلمان بۆ مرۆڤی دێ هێته هژمارتن ب سەدەقه ، پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت: ( لا تحقرنَّ من المعروف شيئا ، ولو أن تلقى أخاك بوجه طليق ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسه یا ڤەگوهاستی .

ئانکو ب کێماسی بەرێ خۆ نەدە خێرێ ، هەتا ئەگەر تۆ بگرنژی دەمێ تۆ برایێ خۆ یێ موسلمان ببینی . وپێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت: ( تبسمك في وجه أخيك لك صدقة ) بنێره پەرتوکا –صحيح الجامع– ژماره ( ٢٩٠٨ ) .گرنژینا ته بۆ برایێ ته

يێ موسلمان بۆ ته ب سەدەقه دهێته هژمارتن .

## بەهایێ دانا ئاڤێ

بابێ هوریره خودێ ژێ رازیبیت گۆت : پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( إن رجلاً رأى كلباً يأكل الثرى من العطش ، فأخذ الرجل خفه ، فجعل يغرف له به حتى أرواه ، فشكر الله له ، فأدخله الجنة ) ئیمامێ بوخاری ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

مرۆڤەکی دیت سەیەك یێ ژ تێهنا ئاخێ د خۆت ، ئینا وی زەلامی کالکا خۆ یا خاڤەی ژپێ خۆ کر و ئاڤ ژ وێ کانیکێ ( ئەوا دەڤێ سەی نەدگەهشتێ )کره کالکا خۆ وپێ دا

سەی هەتا سە تێر بۆ ژ ئاڤێ، و خودێ ب دلوڤانیا خۆ ئەڤ مرۆڤە ئازاکر و برە بەهشتێ.

## خێرا خودانکرنا ئێتیمەکێ

سەهلێ کورێ سەعەدی خودێ ژێ رازیببیت گۆت : پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( أنا وكافل اليتيم في الجنَّة هكذا ) وأشار بأصبعيه : السبابة والوسطى وفرج بينهما ) ئیمامێ بوخاری ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

ئەز و مرۆڤێ ئێتیمەکێ خۆدان کەت ل بەهشتێ هوسانێنە . ئیشارەت دا هەردوو تبلێن خۆ ( یا ناڤێ وشەهادێ ) و ژێکڤەکرن . ئارمانجا پێغەمبەری سلاڤ لێ بن ئەو بوو کۆ خێرا خودان کرنا ئێتیمەکێ د

رێیا خودێدا مرۆڤ دێ ل گەل پێغەمبەری – سلاڤ لێ بن– بیت د بەهشتێدا .

## زەمانکرنا چوونا بەهشتێ!!

سەهلێ کورێ سەعەدی خودێ ژێ رازیبیت گۆت : پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆت: ( من يضمن لي ما بين لحييه ، وما بين رجليه ، أضمن له الجنَّة ) ئیمامێ بوخاری ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

ئەوکەسێ زەمانێ بدەتە من کۆ عەورەتا خۆ ب پارێزیت ژ زنایێ و فاحیشێ، و ئەزمانێ خۆ ب پارێزیت ژ گوننەهان ئەز دێ زەمانێ دەمە وی کۆ ئەو دێ چیتە بەهشتێ .

## تنگژ (غضب) نەبە و بەهشت بۆ تەیـە !!

بابیێ دەردائی خودیێ ژیێ رازیبیت گۆت : زەلامەکیێ گۆتە پێغەمبەری سلاڤ لیێ بن : دلني على عمل يدخلني الجنَّة ، قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : ( لا تغطب ولك الجنَّة ) ئیـمامیێ تەبەرانی و ئەبو یـەعلا ئەڤ حەدیـسە یا ڤەگوهاستی و ئیـمامیێ ئەلبانی یـا دروست کری د پەرتوکا – صحيح الجامع –دا ژمارە ( ٧٣٧٤ ) .

بەریێ من بدە کارەکی کۆ ئەز پیێ بچمە بەهشتیێ، پێغەمبەری سلاڤ لیێ بن گۆتیێ : عێجز نەبە بەهشت بۆ تەیە . ئانکو خۆ ژ عێجزییێ دویر بێخە ، تۆ دیێ بڤیێ دویر ئێخستنیێ چیە بەهشتیێ . وئەڤ چەندە ب

دەست مرۆڤی ڤە ناهێت هەتا مرۆڤ خۆ تەسلیمێ خودێ بکەت د هەمی دەمادا .

## ئینیەتا کارێ چاك .

ئینیەتا کارێ چاك مرۆڤ دێ پلێن بلند بدەستێن خۆڤە ئینیت ، و ب ڕاستی ئەڤە مەزنترین عیبادەتێ دلییە؛ چونکو ئەڤە بۆ هندێ دزڤریت کۆ مرۆڤ یێ ڕاست گوبیت دگەل خودێ ، و ئەو یێ سەرکەفتیە یێ خودێ وی ب سەر بێخیت .

پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت: ( من سأل الشهادة بصدق ، بلّغه الله منازل الشهداء ، وإن مات على فراشه ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی. ئەو کەسێ دوعا ژ خودێ بکەت کۆ شەهادێ ( کۆ ببیت

شەهيد دريێيا خوديێدا ) ب رزقێ وى بكەت ، خودێ دێ پلێن شەهيدا دەتێ هەتا ئەگەر ل سەر نڤينا خۆ بمريت . برا ئینیەتا خۆ بينه ژ بۆ كرنا كارێ چاك دا تۆ وان خێرا بدەستێن خۆڤه بينى هەتا ئەگەر ئەو كارە ب دەستێن ڤه نهێن بەلێ خودێ دێ خێرا وان كاران دەتەتە هەروەكو تە ئەو كارە بۆ خودێ ئەنجامداين .

## بەهايێ جەماعەتێ

عومەر خودێ ژێ رازيبيت گۆت: پێغەمبەرى سلاڤ لێ بن گۆت: ( عليكم بالجماعة وإياكم والفرقة ، فإن الشيطان مع الواحد ، وهو من الإثنين أبعد ، من أراد بحبوحة الجنَّة ، فليلزم الجماعة ) ئيمامێ

**تورمزی ئەڤ حەدیسە ڤەگوهاست و گۆت ئەڤ حەدیسە یا باشە .**

**هوین دگەل جەماعەتێ بن ، وهشیاربن ژ ژێکڤەبوونێ چونکو شەیتان یێ دگەل مرۆڤێ بتنێ ، و ئەگەر دوو مرۆڤ بن شەیتان یێ دویرترە ، و ئەو کەسێ نیڤەکا بەهشتێ بڤێت ، بلا دگەل جەماعەتێ بیت، ئانکو بلا دگەل جەماعەتا موسلمانان بیت و خۆ ژ پارتان دویر بێخیت چ ئاینی بن یان نە ئاینی بن .**

## بەرێ خەلکی بدەیە کارێ چاك وخێران.

**ئەوژی ژ عیبادەتێن مەزنە ، برا هەر خێراکا تۆ بزانی بەرێ خەلکەکێ بدە وێ خێرێ ، و تۆ لدەڤ خودێ شریکێ هەر کەسەکێ وێ**

خێرێ بکەت ، پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت: ( إن الدال على الخير كفاعله ) ئیمامێ ئبن حبانی ئەڤ حەدیسە ڤەگوهاستی و ئیمامێ ئەلبانی یا دروست کری د پەرتوکا – صحيح الجامع –دا ژمارە (١٦٠٥) . وصححه الالباني في. هەر کەسەکێ بەرێ مرۆڤەکی بدەتە خێرەکێ ئەو ژی شریکێ وی مرۆڤییە دووێ خێرێدا ، ئانکو هەروەکو وی مرۆڤی ژی ئەو خێرە کری . ڤێجا هەتا رۆژا قیامەتێ هندی مرۆڤەك وی کاری بکەت تۆ دێ بییە شریکێ وان مرۆڤان هەمییان .

برا ئەگەر تۆ بشێ بۆ خێزانا خۆ ئەڤێ پەرتوکێ بخۆینە دا کاری پێ بکەن و دا تۆ

**ببيە دەرگەهێ خێرێ بۆ خێزانا خۆ ، يان مرۆڤەك نەخويندەوا تۆ بۆ وى ڤێ پەرتوكێ بخۆينە و ببە ژوان مرۆڤان ئەوين خێرێ نيشا خەلكى ددەن، و هەروەسا دبنە شريكێ خەلكى دووێ خێرێدا ، يان ئەگەر تە شيان هەبن تۆ بۆ خێرا خۆ ئەڤێ پەرتوكێ چاپ بكەى ول سەر خەلكى بەلاڤكەى و خێراكا مەزن بدەستێن خۆڤە بينى، خودێ خێرا تە مەزن كەت . ونەبێژە من پێ چێ نابيت ئەز ڤێ پەرتوكێ چاپ بكەم ، خۆ نەترسينە ئەگەر تە شيان نەبن بۆ ڤێ چەندێ بەلێ هندەك مرۆڤێن دەولەمند وخۆدان شيان تۆ دنياسى بێژە وان بلا ئەو چاپ بكەن وتۆ دێ ببيە شريكێ خێرا وان هەتا ڕۆژا قيامەتێ. !!**

# سوپاسی بۆ خۆدێ ،

# پەرتۆك ب دووماهی هات

اللهم اجعل هذا الجهد المقل خالصا

لوجهك الكريم

وصلى الله على نبينا محمد

وعلى آله وصحبه وسلم

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

# ناڤەرۆك